زنجیرەی چیرۆکی پێغەمبەران

# هوود و صاڵح پێغەمبەر

## سەلامی خوایان لێبێت

بسم الله الرحمن الرحيم

**ناوی نامیلکە:** هوود و صاڵح پێغەمبەر
(سەلامی خوایان لێبێت)

**ئامادەکردنی:** محمد عەلی قەرەداغی

**چاپ و دیزاین:** ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

**تیراژ:** ( ٢٠٠٠ ) دانە

**نرخ:** ( ١٥٠٠ ) دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی ( ١٧٦٧ ) ی ساڵی ٢٠١١ی پێدراوە

ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا



دوای کۆچی دوایی نووح عليه السلام نەوەکانی زۆربوون و لە وڵاتدا بڵاوبوونەوەو چەند هۆزو گەل و تیرەیان پێکهێنا. تیرەیەکی گەورەیان کە تیرەی عاد بوون لە زەویی (ئەحقاف) لەباشوری دورگەی عەرەبیدا نیشتەجێ بوون.

تیرەی عاد کۆمەڵێکی بە هێزو بە شان و باهوو بوون و لە ژیانێکی خۆشدا دەژیان و بەتواناو دەستەڵات بوون.

ساڵ هات و چوو و خەڵك ئایینی نووحی باپیرە گەورەیان (عليه السلام) واز لێ هێناو شەیتان پەیی پێ بردن و گومڕای کردن و لە خوداپەرستیی دووری خستنەوەو هاوبەشیان بۆ خودا داناو دەستیان کرد بە بتپەرستیی.

خودای پەروەردگار هوود پێغەمبەری (عليه السلام) نارد بۆ لای تیرەی عاد و، هوود (عليه السلام) دەستی کرد بە بانگکردنیان بۆ خوداپەرستیی و دەستبەردار بوون لە بتپەرستیی. بەڵام تیرەی عاد بەهێزو بازووی خۆیاندا نازین وگاڵتەیان بە هوود (عليه السلام) کرد.



هوود عليه السلام هەر بەردەوام بوو لەسەر ئاگادارکردنەوەی تیرەکەی و لە ئاکامی بێباوەڕی و سەرسەختیی دەیترساندن و، بە تۆڵەی گەورەی خودا هەڕەشەی لێدەکردن ئەگەر لەسەر ئەو حاڵەیان بەردەوام بن. بەڵام گەلەکەی هوود هەر لەسەر ئەو بەدڕەوشتییە مانەوەو بە (هوود عليه السلام)یان دەوت: تۆ شێت بوویت و دەتەوێ لە ئایینی باوباپیرانمان وەرگێڕی.





هوود (عليه السلام) هەڕەشەی لەگەلەکەی کردو پێی
وتن: خودای پەروەردگار نایەڵێ ئەو بێباوەڕی
و یاخیبوونەیان بەسەردا بڕوات و سزاو تۆڵەی
سەختیان دەدا بەسەردا. بەڵام گەلەکەی
گوێیان بەو هەڕەشەو ترساندنە نەداو لەسەر
بێباوەڕیی خۆیان بەردەوام بوون. تا خودای
پەروەردگار باوباگژەیەکی توندی بۆناردن
هەشت شەوو ڕۆژ کوتانی، تا هەموویانی
لەناو بردو خودا هوود و خاوەن باوەڕەکانی
لە گەلەکەی ڕزگار کرد و، هوود (عليه السلام) لەسەر
ڕێبازی خوداناسیی و بانگەوازی خەڵك بۆ ئەو
ڕێبازە مایەوە تا کۆچی دوایی کرد.



دوای ئەوەی خودای پەروەردگار گەلەکەی عادی لەناوبرد، گەلێکی باش و لە خودا ترس جێگەیانیان گرتەوە، کە گەلی (ثموود) بوون.



زەوییان ئاوەدان کردەوەو باخ و بێستانیان پێکەوە ناو، خودا نیعمەتی زۆری ڕژاند بەسەریاندا، پاش ماوەیەك لایانداو سوپاسگوزاریی خودایان نەکردو بێباوەڕ بوونو کەوتنە بتپەرستیی.



خودا پێغەمبەرێکی بۆ ناردن ناوی صاڵح بوو(عليه السلام)، بانگی کردن بۆ خواناسیی و یەکتاپەرستیی. بەڵام ملکەچ نەبوون بۆ خوداو پەلپ و بیانوویان پێ گرت و داوایان لێ کرد موعجیزەیەکیان پیشان بدا کە بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی لە لای خوداوە هاتوە بۆ لایان. صاڵحیش(عليه السلام) داوای موعجیزەی لەخودا کرد. خودا داواکەی صالحی(عليه السلام) جێبەجێ کردو وشترێکی گەورەی لە بەردێک بۆ دەرکردن.

صالح عليه السلام پێی وتن:
دەبێ ڕۆژێك لێ بگەڕێن
وشترەکە ئاو لەبیرەکە بخواتەوە و
ڕۆژێکیش ئاوی بیرەکە بۆ ئێوە بێت
و، هیچ زیان بە وشترەکە مەگەیێنن.
بەڵام قسەی صاڵحیان عليه السلام شکاندو
چەند بەدکارێکیان وشترەکەیان پەی
کردو کوشتیان.



صاڵح عليه السلام زۆر لەو کردەوەیان توورە
بوو، هەواڵی دانێ کە دوای سێ ڕۆژ
تۆڵەی خودایان دێ بەسەردا.



هەروەك هەواڵەكەی صاڵح عليه السلام ڕۆژی یەكەم گەلەكە ڕەنگیان زەرد بوو، ڕۆژی دووەم ڕەنگیان سوور بوو، ڕۆژی سێهەم ڕوویان ڕەش بوو. دوای ئەوە گرمەو ناڵەیەكی گەورەیان بیست و زەوی لە ژێریانەوە تەكانیداو هەژاو هەموویان مردن.

خودا صاڵح عليه السلام و خاوەن باوەڕانی ڕزگار كردو، صاڵح هەر خەریكی بانگكردنی خەڵك بوو بۆ لای خوداپەرستیی تا كۆچی دوایی كرد.

